## ژ بۆ شەریف پاشا

دیسا ژ شەجاعەتا تە ئەی خان
دەرییەك ڤەبوو ژ بۆ مە کوردان

ئێدی بەسە ئەڤ جەفا و زیللەت
بێ عیلمو فەزل بمنینە میللەت

ئەڤ عەسرە بلندییێ دخوازت
هەتا وەکو ژین چیە، بناست

فەخرێ دکەین ئەم ب تە، تو کوردی
ئەلهەق کو تو مێری، هەم تو مەردی

پشتا تەیە جوملە کورد، کورمانج
لەورا کو تە حەق کرییە ئارمانج

کورمانج هەقیقەتا شینانە
لەورا کو د وێ رێی دا فیدانە.

ئەم دێ بلند بین هندێ، هەتا بگەهینە ئەو جان
وەختێ فەلاحبوونێ، زەمان ژی ئەڤ زەمانە
گۆتن ڤەکرن دایان جڤاتەکێ بلندی
یا رەب تو پێکڤە بینە، تەوفیقەکێ دە وانە
رەحمی نەدیت کو لایق تەقدیم بکەت هەدییە
هەدییە ئەگەر قەبوول بت وی دایە جسم و جانە.



## ژ بۆ جڤاتا دایکان

پرسی ژ عەسرێ دەوران:
((فەنو تەرەقییا تە دەوڵەت سەرێ چییە؟))
گۆت ((دەوڵەت سەرێ ژنانە))
لەورا قە ناحەون ئەو، شەڤو رۆژ وان خەباتە
جا زارییەك مەزن کەن، ژینا وەلات ب وانە
ئینسان بە ئەسلێ فیترەت نە قەنجە، نە خرابە
قەنجو خرابی یا مەب راکرنا دیبانە
ئەمرێ رەسولی: ((جەننەت بن پێی ئوممەهاتان))
لەورا دەها، زەکاوەت ب تەربییا ئەوانە
عیلم، فەزیلەتا وان هندی بکەت تەرەققی،
تەجهیز ببن موکەممەل ب ئەخلاقێ مادەرانە

رۆڤار
ژمارە
٥٧
تشرینی
دووەمی
٢٠٠٩

عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری

## فیرقەت

هاتفی وی گۆتە من: هیجرانە، زوو کارێ خوە کە
ئاشقان سەر بر گرینە، رۆهنیان ب نارێ خوە کە

رۆهنیان ب ئاگر بڕێژە، دا نەسوۆژت عالەمێ
دەر عەقەب چاڤان جهاب دایێ، مژان کەتنە خەمێ

کانییا دەردان کو دەر بوو، جو و جۆبار کەتنە روو
رەنگێ سیمایێ ملەووەن گاهـ سپی، گاهـ زەر بوو

من نەما تاقەت، هەردەم رۆحێ مەدهووش بێ خەبەر
ساعیقا هیجرێ کو ڤێکەت، من نەما ژ ژینێ ئەسەر

شێنییا رۆیێ ل مە گرت تارییا د شکلێ مەدا
وان د ناڤ بەینا خوە چێکر، قەت رۆحی ئەمرەك نەدا.

## ویسڵەت

چوومە وەلاتی، حالەك حەزین دیت
دایکا خوە ڤێ جار ب خوین، برین دیت

گوهان زوها بوو، دایکا بریندار
نەشییا خوەدان کەت مندالً، بچووك، ژار

چوومە ل سەر، من زێن دا برینێ
رۆهنك رەشاندن، بەردا گرینێ:

دادێ، تە خێرە! گێسوو بەلاڤی!
کانێ ژ تە ناییێت بێهنا گولاڤێ

گاڤا تو قیز بووی بسکێت پەریشان
تۆزێ پێچایە خال، نیشان



## گازییا دویماهیکێ

رابە ئەی کوردێ ژ کوردان
سەر ژ ئێخسیریێ هلین
داوەشە ژ تۆزو غورباریێ
عیلمو عیرفانێ ببین.

دێ هەتا کەنگی خولام بی
تو دبن پشتییان حەمال
شەڤ مە بۆراند، رۆژ دەرکەت
رابە جا ئەم بچینە مال.

مالا من گۆتی خرابە
تێ نییە باب، برا
هندەك ئێتم ماینە شەڤێ
د تارییێدا، بێ چرا.



دەستێ خوە نادی ڕامووستن، گور
شەفەقەت، مەحەببەت ڕاکر، تە بیر کر

پێنج سالە ئیرۆ ژ تە جودا بووم
دیل بووم، بریندار. هاتم، خۆیا بووم

ئەڤە ڤەگەڕیام، هاتم حوزوورێ
گەر دێ هەبیتن، بەخشە قوسوورێ

دەنگێ م گوهـ کەت، چاڤێ خوە ڕاکر
ڕۆهنك نەمابوون، خوین ژێ ڤالا کر

گۆت: ئەی کوڕێ من، ب خێر تو هاتی
تو ل کێ دەرێ بوو، دوور بوو ژ وەڵاتی؟

پاش کو تو چوویی، دۆست بوونە دژمن
هەر دو دگەل یەك ڕابوونە سەر من

ئینساف نەمابوو، دین بیرکرن وان
خوارن، ڤەخواردن خوینا مرۆڤان

تالان کری نامووسان ژ قیزێ
سەر ژێ دکرن وان بۆنا لەیزێ

***

ئەز چوومە باخان: بێ دار، دوور بوون
مەشییا مە ڕاخان، بێ هەسپێ گەور بوون

من گۆتە بلبل: ما گول تە دەر دا؟
من دی کو کوندەك دەرحال جەواب دا:

کا بلبلێ ژار! ڤا دین بوویی تو
سەرحەد خرابن، پێنج سالە ئیرۆ

سۆتن، قەلاندن باخ و گولستان
سۆر گول نەهێلان، بلبل نەوەستان.



## شەهیدێ کوردستان... حەمزە

رابەر ژ خەوا خوە، حەمزە، رابە
خوینا تە نەچوو هەبا تو شابە

رییا ڤی وەلاتی دا شەهیدی
لەورا تو موجاهیدەك سەعیدی

رابە هەرە پێش لقایێ یەزدان
ب خوینا دچیتن ژ وان برینان

سۆرکە کەفەنێ ب رەنگێ ئالا
مەزلوومی بکە تو عەرزی حالا

بێژە: تو عالمی بێ میسالی
بێژە: تو سەمیعی لا یەزالی

زلما مە هاتی تو دزانی
لەورا تو قادر و (کن فکان)ێ

باژێرو کەلاتو خانو مان چوون
بێ شوکرێ تە ناچتن مەدانەك

حاشا تو نە زالمی نیکووکار
ئەم جاهلو بێ خەبەر گونەهکار

دەدرێ ڤێ جەهالەتێ دکێشن
ئەو عللەتە ئەم ژ بەر دئێشن

دۆستێ د مە وەك شەیر دوژمن
صادق مە نەدی برایێ موئمن

دوژمن وە هەیە بکت مەحەببەت
هەتا نەچتن ژ مە جەهالەت

ئەم موعتەریفی بەتالینە
ما غەیری تە ئەم عەبیدێ کینە

ئەلبەت ل گەل ئیعتراف و نوقصان
دیسا ژ تە دێ بخوازن ئیحسان

ما دەم خولقاندن ئەم تە مللەت
لازم ژ مە ژی هەبت حکوومەت

داخوازێ بکەن ژ تە تەبایی
لەورا تو (تعز من تشا)یی

تو حەز بکی دێ ڤەبت سەعادەت
دێ هل ببتن شەمالێ مللەت

خوین دێ بکەلت ببت حەمییەت
حەتتا کو نخمینن جەهالەت

گلیێ تە بەلێ خودایێ موطلەق
دێ بێتە جهـ ئەی شەهیدێ ناحەق

تو بەرزە کرن ب جەبرێ تەهفیر
مەعصوومی د تە نەمایە تەقصیر

ئیرۆ من دخوەزت بگهێمە (ژین)ێ
تاقەت من نەما ژبەر گرینێ

مەولا تە ب رەحمەتا خوە شاکت
خوینخوار و سادیان ژ مە جودا کت.

# مەمی ئالان

ئەسەری[1]: عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری
گۆڕینی زار: نەورۆز حاجی سەیدگوڵ

شانۆی کوردان فەزیلەتی کوردان نۆش دەدات[1]

دوو پەردە پیەس

کەسەکان:

١. مەمی ئالان
٢. لەوەند– هاوڕێی مەم و خولامی میر
٣. دایکی مەم– چاوڕەش
٤. ژنی مەم– غەزال

پەردە کرایەوە

(ژوورێکی کوردانەی ڕازاوە بە بەڕ و مافوری ڕاخراو، دیوارێکیان چەکەکانی مەمی پیا هەڵواسراوە و پاڵ دیوارەکان دۆشەك و بالیفە)

دانیشتنی یەکەم

**مەم**: (تەنیا) بەڵێ... ئەمڕۆ میر ئەمری کردوە، غەزایە. ڕێگرتنە لە نەیاران. نەبا خوا نەخواستە زاریی کوردان بەر دەست و پێی دوژمنان کەوێ.

من لە کێ کەمترم، گوایە من کورد نیم، چما ناموسی کوردان ناموسی من نیە! بێگومان بێگومان.. دەبێت بچم. گەر قیامەتیش بێت هەر دەچم. خوێن سەر سەران بکەوێ خۆم پێ ڕاناگیرێ. تەنانەت غەزالیش ڕێم لێ بگرێ من هەر ناوەستم. من مەمی ئالانم. میری هەکاری ئەمری کردوەو سوڵتان سەلاحەدین شیری خۆی لە کێلان دەرکێشاوەو لە پێشەوەی ئەو هەموو عالەمە وەستاوەو پاریزگاری لە قودسی شەریف ئەکات. خەڵکانی غەیرە دین کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی ئەوێ لە موسوڵمانان بستێنن. وەڵام بۆ میری هەکاری هاتوە کە دەبێ ئێمە بچینە یارمەتییان. موسڵمانان هەموو لەوێ کۆبوونەتەوە. بۆ چ شتێ؟ دیارە بۆ غەزا. چما من لەوان نازدارترم. چما خێری غەزا هەر بۆ ئەوان بێت.

(دایکی مەم لە دەرکەوە هات کاتێ دیتی کوڕەکەی ئاوها پڕ جۆش و خرۆشە)

**چاوڕەش**: کوڕەکەم، خوا بە خێری بگێڕێ، ئەوە تۆ چیت بیستوە ئاوها پڕ حیددەتیت و چاوەکانت سوور بوونە؟

**مەم**: دایە شیری خۆتم لێ حەڵاڵ کە. دوژمنان هاتوونەتە سەرمان و هاتوون قودس لە ئیسلام بسێنن. ئەوا میر ئەمری کردوە غەزایە و دەبێ بچینە ئەم غەزایە. مادامەکیش کوردم و لە ئالانم و باو و باپیرانم لەم ڕێیەدا بوونە، پێویستە منیش بە هەمان ڕێدا بڕۆم. تۆ شیری سپیت داوەتە من، ئەو شیرەتم لێ حەڵاڵ بکە.

---

[1] بەرز ڕادەگرێ



دانیشتنی دوەم

(دەنگی دەرگا دێ)

**مەم:** دایە ئەوە دەرکەیە. (هەڵدەستێ) ئەوە کێیـە؟ ئـۆ و و و .. لەوەندی برام، فەرموو.. فەرموو..

(لەوەند دێتە ژوورەوە)

**لەوەند:** ئەسەلامو ئەلەیکوم. (دەچێتە لا شانی چاوڕەشەوە).

**چـــاو ڕەش:** ئەلـــەیکومو ســـەلام، فـــەرموو دانیـــشە (لەوەنـــد دادەنیشێت) سەر سـەری مـن هـاتی، سـەر چـاومان، تـۆ باشـی؟ خۆشی؟ ماڵ و منداڵ چۆنن؟

**لەوەند:** خوات لێ ڕازی بێت. ماڵ و منداڵ دەستت ماچ ئەکەن.

**مەم:** سەر سەری برای خۆت هاتی.

**لەوەند:** سەرت هەزار ساڵەیی بێت. تۆ خۆت کۆ کردۆتەوە. دادە ڕێگەی داویتێ؟

**مەم:** لای ئێمە تا ئێستا ئەو ئەمر ئەکات. دایکم شیری خـۆی لـێ حەڵاڵ کردووم و کارەکانی من دەکات، خودا حەز کـات، ئێمـەش کەی بڕۆین؟

**لەوەند:** ئەمڕۆکە کەسێك لە باشگالان هاتۆتەوە، گوایا میر هـەتا چۆڵەمێرگ چوە، وا پێویست ئـەکات ئێمـەش لـەم هەفتەیدا لـە چۆڵەمێرگ جەم بین.

**مەم:** ئەمڕۆ خۆتان کۆ بکەنەوە، سبەی بە زووی بەڕێ دەکەوین.

**لەوەند:** ئەمر بفەرموون منیش بچم خۆم کۆ بکەمەوە.

**مەم:** سەر سەری من هاتی.

(لەوەند ئەڕوات)

**چاوڕەش:** (خۆی بۆ خۆی) یـاڕەبی ئەولادەکـەم ئەمانـەتی تۆیـە، تـۆش فرسـەت و سـەلامەتیی بـدەیتێ. (تەماشـای مـەم دەکـات) کوڕەکـەم خـودات لەگـەڵ بێـت، مـن ئـەڕۆم تویـشووی تـۆ حـازر ئەکەم.

(چاوڕەش دەڕوات)

**مەم:** (خۆ بەخۆ) ئەی خالقی من، تۆ چ لوتفێکی گەورەت نواندوە وا ئەو دایکە میهرەبانەت داومێ، کە هەرچی دڵی من بیـەوێ ئـەو پێی ڕازیە. هیچ جارێك نابێتـە ڕێگـری ئیـشێکم، کـە مـن غـەزالی تۆبووکی یەك هەفتەیی جێ دەهێڵم، چما ئەمـە ئینـسافە؟ بـەڵێ ئینسافە، چونکە خۆشەویستیی وەڵات لە هەموو خۆشەویستییەك مەسترە. ئەویش ڕازییە من بچم غەزا بکەم و ئەویش ببێتـە ژنـی غازیەك. بۆیە پێویستە شانازیشی پێوە بکات.



(کەمێك بیری کردەوە، غەزال لە دەرکەوە دێ، بە دەسماڵەکەی دەستی چاوانی دەسڕێتەوە، مەم دەستی دادەگرێتە خوارێ.

**مەم**: غەزال، چ خێرتە، بۆچی دەگریی؟

**غەزال**: چما ئێوە ناڕۆن؟

**مەم**: بەڵێ، جا بە ڕۆیشتنی من پێویستە تۆ بگریی؟

**غەزال**: کە تۆ ڕۆیشتی من چی بکەم، ژیانی من مەحاڵە، ڕۆحم دەردەچێت، بمبە لەگەڵ خۆت.

**مەم**: لە شەڕی وادا عەیبە ژنمان لەگەڵ بێت، لەملاشەوە دایکم تەنیایە. تۆ دەبێت چاوت لەویش بێت.

**غەزال**: من شەو و ڕۆژ کارەکەرێنیی دایکی تۆ دەکەم، بێتاقەت نابم و هیچیشم نەکردوە.

(فرمێسك لە چاوی دەردەکەوێ) منیش ئەم چاوانە دەدەمە دەست خودای گەورە ئەوکاتەی کە چاوم لە تۆ نیە.

**مەمۆ**: (بە گۆرانییەوە)

ئیرۆ هەفتە داوەت کری

غەزایە ئەز ژ تە کری

ئەز دچمە بەر کافری

غەزالا من دەلالا من بەس بگری[٢].

**غەزال**:

مەمۆ ئیرۆ بوو عەسکەرە

ئەڤینیا من بوو کەسەرە

تۆ من ببە دگەل خوە، هەرە

یان بکوژە، یان بکوژ، پاشی هەرە[٣].

**مەم**: تۆ بەس روهنکان ببارینە

ئیرۆ دژمن مە کینە

وەستانا من لائیق نینە

غەزالا من دەلالا من بەس بگری[٤].

(غەزال لە هۆش خۆ دەچێ)

پەردە دادەرێتەوە

## پەردەی دووەم

(پەردە دەکرێتەوە، هەمان جێگای پێشوو، غەزال بە تەنیا لەسەر دۆشەکێ دانیشتوە، ئێکجار قوولبۆتەوە لە بیرکردنەوەیدا)

**غەزال**: ئای خوایە گیان، ئەوە بوو بە ساڵێ و هیچ وەلامێکی مەمم پێ نەگەیشت، تۆ بلێی جارێکی تر مەم ببینمەوە، بریا فریشتەی مەرگ دەهات و ئەمانەتەکەی لێ وەر دەگرتمەوە!

(هەڵدەستێتە پێیان)

---

[2] ئەمڕۆ و ئەم هەفتەیە دەعوەتکراومەتە غەزایەکەوە کە دەچم بەر لە کافران ئەگرم، غەزالەکەم نازدارەکەم بەس بگری؟

[3] مەمۆ ئەمڕۆ بوویە سەرباز کە خۆشەویستیمی پێ کەسەر بووە، دە بمبە لەگەڵ خۆت و بڕۆ، یان بمکوژە دوایی بڕۆ.

[4] تۆ بەس فرمێسك ببارێنە، ئەمڕۆ دوژمن لێمان بە قینە، بۆیەکا وەستانی من بۆ من شیاو نیە، غەزالی من نازداری من بەس بگریێ.

ئای .. ئای.. ئەمە چ ژیانێکە، چما مرۆڤ بۆ دەردو ئازار هاتۆتە دونیاوە !

**چاوڕەش:** (لە دەرکەوە دێ) غەزال، خوا خێرت بنووسێنێ ئەوە چیتە؟ ئەوە دیسان دەگرییی؟ نا بۆ کوڕی من مەگریٚ. ئەمڕۆ مزگێنییەکم پێیە، کابرایەك لە ئۆردووگاوە گەڕاوەتەوەو گوایە لەشکری ئێمە دوژمنیان بەزاندوەو دوژمن تەسلیم بووە، مەمیش سەلامەتەو خۆشی پێ گەیشت لەو ڕۆژانەدا دێتەوە.

**غەزال:** (بەئاگا هاتەوە) خوایە بە دەمی تۆ بێت.

(خۆی کۆ کردەوە، لە گوتنەکەی پەشیمان بۆوە، چونکە لە بەردەم خەسوویدا کەمێ شەرمی کرد)

**چاوڕەش:** غەزال، خودا وەك چۆن مەمی داوەتە من، تۆیشی بۆ مەم هێناوەتە دونیاوە، شەرم مەکە، من شانازی بەوەوە دەکەم کە تۆ بووکمیت، مەم چەندێ نەبەردە تۆش هێندە نازداری، مەم چەندێ جوامێرو پیاوچاکە، تۆش ئەوەندە غیرەتداری. ئەم قسانەم لە بەردەمتدا نییە، بەڵکو خوا شاهیدە، لە هەموو دونیا وا دەڵێم، چوون ڕاستیەکانی مرۆ گەر ئینکاری لێ بکرێ ئەوە بێ ئینسافیە، خودا هەردوکتانم بۆ بهێڵێ.

(دەنگی دەرکە دێ، غەزال دەچێت)

**غەزال:** ئەوە کێیە؟

**دەنگەکە:** منم.

(خوڵامێك لە دەرکەوە دێتە ژوور)

**خوڵام:** پوورێی چاوڕەش، خانمم وتی تا ئێرە بفەرموێ.

**چاوڕەش:** (ڕوو لە غەزال ئەکات) غەزال من بۆ ئەوێ ئەڕۆم، ئەمانەتی تۆو ئەم دەرکەیە.

(چاو ڕەش دەڕوات و غەزال تەنیا دەمێنێ).

**غەزال:** ئاه.. ئاه.. خەسووم مژدەی داومێ، تۆ بڵێی ڕاست بێت و جارێکی دی بگەینەوە یەك؟

(دەنگی دەرکە دێ، غەزال ڕادەچڵکێ)

**غەزال:** ئەوە کێیە؟

**دەنگەکە:** میوانە.

(بە سەرپۆشەکەی پێش دەمی خۆی دەگرێ و دەرکە دەکاتەوە).

**غەزال:** فەرموو. (تەماشای دەکات و نایناسێتەوە)

**میوان:** سەلامون عەلەیکوم.

**غەزال:** عەلەیکوموسسەلام، فەرموو، سەر سەرم هاتی.



**میوان:** (دادەنیشێت) خودات لێ ڕازی بێت.

**غەزال:** (قاپێك ئاو دێنێت، دەست بە سنگەوە دەگرێت)، فەرموو.

**میوان:** (وەری دەگرێت، ئاوەکە دەخواتەوە) من زۆر سوپاست ئەکەم.

(غەزال دەچێت نان ئامادە بکات)

**میوان:** زەحمەت مەکێشە. لەو لایە وەستام، ناتوانم هیچ بخۆم.

**غەزال:** میوان میوانی خودایە، چۆن ئەمر بکەن ئێمە مەجبوورین ئەمریان بەجێ بێنین.

**مێوان:** بێ عەیبی نەبێت، پرسیار عەیب نییە، ئەمەوێ شتێك بپرسم.

**غەزال:** ئەمر کە.

**میوان:** ئێوە کچی ئەم ماڵەن یان بووك؟



**غەزال:** گەر میوان نەبوونانەیە، لە بەرانبەر ئەم سوئالەتا دەبوو بە چەك وەڵامت بەمەوە، ئەوە هەیە کە تۆ میوانی. قەدری میوانیش لەسەر ئێمە واجبە، چونکە کوردان لەماڵی خۆیاندا شت بە میوانیان نالێن و هەمیشە کوردان گیانیشیان داوە لەڕێی میوانیاندا. دوژمنیش ببێتە میوانی کورد، هەر قەبوڵ دەکرێن و ڕێزیان لێ دەگیرێ و خزمەتیان دەکرێ.

**میوان:** غەزالی من، سەد ئافەرین بۆ غیرەتی تۆ، من شانازیت پێوە ئەکەم. من مەمم. ئەو شیرەی پێت دراوە لێت حەڵاڵ بێ.

(هەڵدەستێتە سەر پێیان و دەستی غەزال ئەگرێت)

**غەزال:** (بێ ویست هەرەکەتی دایە خۆی) ئاه ئاه.. (هەردوو لێك ئالان و کەوتنە سەر دۆشەك و هۆشیان بە دونیا نەما و بێ هۆش کەوتن)

**چاوڕەش:** (لە دەرکە دەدات و کەس نایکاتەوە. دەرکە دەشکێنێ و خۆی دەکا بە ژووردا، بووکەکەی بەو حاڵ و ڕەنگە دەبینێ لەگەڵ یەکێك کە نایناسێت). سەیرە، قەت بووە شتی وا ببینم، ناموسی کوڕەکەم ئاوها لەگەڵ نەیارێکا ڕاکشابێت، ئەمە چ خیانەتێکە؟ نا، نەخێر. (جارێکی تریش سەیریان دەکاتەوە). وا پێویستە یان ببڕم یان بکوژم، هەر کوردێك ناموسی خۆی ئاوها ببینێ ناوەستێ، بەڵێ ئەمە ناموسی منەو ئەمانەتی منە!

(جارێکی تریش تەماشا دەکات و لە پڕمەی گریان ئەدا).

**چاوڕەش:** بەڵێ.. بەڵێ.. کوشتن.. لە غەیری کوشتن چی ترم نییە. خوداش لێم ناپرسێتەوە چونکو لەسەر ناموسە.

(ڕادەچڵەکێ و ڕمی هێنا، لە سنگی کوڕەی دەچەقێنێ)

**چاوڕەش:** ئەمە بۆ تۆ، ئەی بێ ناموس، ئەی جانەوەری بێ ناموس!

**مەم:** ئای دایە.

**غەزال:** (هۆشی دێتەوەو ڕم لەسەر سنگی مەم دەمینێت، بە خەسووی دەڵێ) وای تۆ چاوانی خۆت کوێر کرد. (ئەیکێشا بە تەپڵی سەری خۆیدا).

**غەزال و چاوڕەش:** (هەردوك پێکەوە بە یەك ئاوان).

هەرێ مەمۆ، مەمێ ئەباسی، ئەباسی

بریندارۆ مەمۆ، دایێ کۆر بت، نەناسی[5]!

---

[5] ئەی مەم، مەمی عەباسی، مەمی بریندار، ئەو دایکەت کوێر بێت کەوا نەیناسیتەوە.

# زنجیرەیەك وتاری
# عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەكاری
# كە لە گۆڤارو ڕۆنامەكانی سەردەمی خۆیدا
# بڵاوی كردۆتەوەو نووسیونی.

نوسینی: عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری
گۆڕینی زار: نەورۆز حاجی سەیدگوڵ

**شەڕی تۆپان[1] تەواو بوو،**
**ئەمڕۆ پێنووس شەڕ دەکات**

هـەموو کـەس ناچـارە پارێزگـاریی مـافی خـۆی بکـات. ئەگـەر نەیکات مافی ژیانی نییە. پارێزگاریی ماف بە دوو شێواز دەبێت: یـان بـە هێـزی بـازوو، واتـا بـە هـۆی تفـەنگ و تـۆپ و بۆمبـا و دەمانچەوە دەبێت، یان بە هۆی زانستی مافەوە دێتە مێژووەوە.

کـاتی تـۆپ و تفـەنگان بەسـەر چـوە، چـونکو بەوانـە مـاف ناسەلمێنرێ، بەڵکو ماف بە {هێز}ە، لایەنی سەرکەوتوو خاوەن هێزەو لایەنی ژێرکەوتووش بێ هێز و بێ مافە.

دەمێکە بە شەڕی تۆپـان مـاف ناسەلمێنرێ، ئێمـە ئـەزموونمان کـردوە، وڵات بـە خـوێن شـۆرراییەوە، زۆر بـچوك بـێ دایـك و بـاوك مانەوەو هەتیو و یەخسیر کەوتنە کۆڵانانەوە. زۆر بنەماڵـە مـەحف بوونـەوە، زۆر خـانوو و خێـزان بـڵاو بوونـەوە، پەرێـشانی لەسـەر پەرێشانی، کـە هـیچ سـوودێکی نـەبوو. هێنـدێکی تـر بوونـە هـۆی فەلاکەت،. ئەوەیە شەڕی تۆپـان تـەواو بـووە. ئـەم جـارە هـەموومان دەزانین ماف بە هۆی زانایەتییەوەیە. پێنووس هەڵبگیرێ. ئێوە لـە ڕۆژنامەکاندا دەخوێننـەوە کـەوا ئەنجوومـەنی ئاشـتی (مەجلیـسی صلح)، وا کۆ دەبنەوە: کە لە ڕۆژنامەیەکا دەیگوت:

(( لـە ٢٨ی کـانوونی یەکـەم ئەنجومـەنی ئاشـتی دەسـتبەکار دەبێـت، هـەر کەسـێ شـیکایەتێکی هەیـە بـا نەوەسـتێت، بـە پێـی زانـستی مافناسـی، زانـستی هاوچـەرخ، زانـستی زەویزانـی[2] و مێژووزانی، بێتـە ئـەم ئەنجومەنـەی کـەوا هـەموو دونیـا لـەوێ کـۆ دەبنـەوە، داوای سـەلماندنی مـافی خـۆی بکـات و ببێتـە خـاوەن ماف)).

داخـوازی بـە تـۆپ، تفـەنگ، شـەش دەربـان[3] و بۆمبایـان تـەواو بـوو. داخـوازی بـە پێنووسـە. هێـزی زانـست و زانـین دادوەر (حاکم)ی هەموو شتەکانە. پێویستە خاوەن پێنووسەکان خـەبات بکەن و خاوەن پارەکانیش هیمـەت بکـەن، ئەوەی دەیدەنـە تـۆپ و تفەنگ، چارەکی ئەوە بدەنە پێنووسی زانست و ڕۆژنامـە. چـونکو هەموو کەس تێگەیی تۆپ و تفەنگ هێندەی پێنووس کار ناکات. ئەو جێیانـەی بـە تـۆپ داگیر کـراون بـە پێنـووس بیگێڕنـەوە. وەك

[1] واتا خەباتی چەكداری.

[2] مەبەست جیۆگرافیایە.

[3] ناوی چەکە.

سربستان، بەلژیکا، قەرەداخ[4] و ڕۆمانیا کە بە تۆپ داگیر کران، بە پێنووس گەڕێنرانەوەو هێندەی تریش مولکستانیان بۆ خۆیان زیاد کرد. زانراوە کە شەڕی تۆپان تەواو بووەو شەڕی پێنووسانە، ئێمەش هەندێ خاوەن پێنووس بنێرینە ئاوروپا تا بە پێنووس خەبات بکەن و ماڤ ئێمە بسەلمێنن.

## بارودۆخی ئێستای ئێمە

کوردان لە ناو ئوسمانییاندا لە هەموو میللەتانی تر ڕاستگۆتر دەرکەوتووین، کە ماڵ و گیان و هەموو شتێکی خۆمان لە ڕێی ئوسمانیدا بوو، هیچ ڕۆژێك نابەجێییەك لە ژێر فەرمان دەرنەچوونێکمان نەکرد، هەمیشە چ ئەمرێکیان کردبێت، بۆمان بەجێ هێناون.

تەنانەت لەم جەنگەشدا "یانی شەڕی یەکەمی جیهانی"، ئێمەی کورد لە هەمبەر ئەم جەنگە و لە هەمبەر ڕاگواستن لە هەموان پەرێشانتر بووین. ئەوەتا لە هەموو میللەتانی دیکە زیاتر زەرەرەوەمەند بووین. لێتان ئاشکرایە، ئێوە هەر ڕۆژ ڕۆژنامە دەخوێننەوە کە لەم جەنگەدا ئێمە بە شکاو نیشان دراوین، ئێمە لەسەر داوای سەرۆك کۆماری ئەمەریکا (ویلسون) داوای دانوستانمان کرد. واتا موتارەکە (بایکۆت) کراین، لەبەر ئێمە بوو بولگاریش موتارەکە (بایکۆت) کرابوو، کە دواتریش ئاوستریا[5] و ئاڵمانیش موتارەکە (بایکۆت) کران.

دونیا زۆرێك لە هەمانەی خوێندا بینرا، هەمو کەس نەفرەتی لە یەکدی کوشتن کرد، هەموو کەس لە لای خۆوە بیری لە هۆیەکانی بەختیاری کردەوە، بیری ویلسون لە هەموویان دروستترە. بۆیە دەڵێن ((دەبێت هەموو میللەتێ بە سەر[6]ی خۆی ئیشی سەری دیکە نەکات))، یانی میللەت توانایەکانی خۆی بە دەستی خۆی هەڵکات، هەر میللەتێ ئەمە لە خۆیدا دەبینێت با ببێتە حکومەت.

لەم ڕووەوە ئێمە وای دەبینین عەرەب، جولەکە، فەلە، گورجی.... هەر یەکە بۆ خۆی حکومەتی دروست کردوەو ئێستا کاری خۆیان بە دەستی خۆیان ئەکەن. بەڵام ئێمەی کورد تا ئێستا هەستمان نەکردوە کە لە بەر دەستی حکومەتی تورك دەر بچین، واتا لە ڕێکخراوەی ئوسمانی دەرنەچووین. ئەوا تەماشاش ئەکەین کە نیلسون دەڵێ ((جێی تورك ناوچەی ئوسمانیان نییە)).

[4] ئەم قەرەداخە قەرەداخی ناوچەی سلێمانی نییە، بەڵکو شوێنێکی تری ژێردەستەی عوسمانی بوو.

[5] ئاتریش= نەمسا.

[6] فیکر.

حاڵ ئەوەیە کە بە جێی ئێمە دەوترێ ((کوردستان)). جگە لە دوو سێ نێرراو کە بە نێرراوی نێررابوونە ئێرە و بۆ ئەوە چوون کە ئەم جێیە هی تورك نیە، بەلام وەکو هی تورك نیە چما هی ئەرمەنی و مخەین[7]؟ ئەو ئەرمەنییانەی لێرەن لە سەدا پەنجای ئێمە نین، مخەینیش سەدانی کام میللەت دەبن. زانراوە کوردستان ماڤ کوردانەو جگە لە کوردان، ماڤ کەسی دیکە نیە. سەد حەیف کە تا ئێستا خۆمان نەناساندوە. ئاوروپا نامانناسن و بە گەورەمان نابینن و کوردستان بە تێکەڵەی ئەرمەنستان دەزانن. تەنانەت هەندێك لە خاوەن غەرەز ئێمە بە ئەرمەنی دادەنێن.

ئێمە کە ڕوو لە زانست دەکەین، پێویستیی زۆری بە هەوڵ و غیرەت نابێت و بە هەوڵی هەندێك ئێمە ئەم مافەی خۆمان درك ئەکەین، (ئێمەش لەم ڕوەوە قسوور ناکەین و تێ دەفکرین).

بەڵێ کوردستان ماڤ کوردانە. جگە لە کوردان هیچ کەس خاوەن ماف نییە لە کوردستاندا. بیری ویلسون یش ماڤ ئەوەی داوینێ ئێمە ببینە خاوەنی کوردستان. گەر نەشبینە خاوەنی، ئەو خەیاڵە نەکرێ کەوا ئەرمەنی ببێتە خاوەنی کوردستان و ئەم وڵاتەمان لێ داگیر بکەن.

ئەوەیە کە دەبێت هەموو میللەتان چ بچووك چ گەورە، ئەرکەکانی خۆی بزانێت و دەست بە کار بێت، چونکە کاتی وەستان نییە، کاتی خەباتە، گەر خودا یار بێت.

## عیبرەتێکی بچووك

گەلی برادەرینە!

دونیا بە چاولێکەری ئاوەدان بۆتەوە. مرۆڤ چاو لە برادەری خۆی ئەکات، ئەو چۆن خەبات بکات ئەمیش دەبیت وا بکات و بەڵکو زیاتر خەبات بکات.

لێتان ئاشکرایە، لە کوردستاندا دوو میللەت هەیە، یەکێکیان میللەتی خۆمانەو ئەوی دی هی فەلە، ئێمە وای دەبینین و لە ڕۆژنامە پێش چاومان کەوتوە کە ئەوان شەو و ڕۆژ لە خەباتدان و مرۆڤیان سەرسام کردوە. هەر ڕۆژەی ڕۆژنامەیەك و هەر ڕۆژەی کۆمەڵێك و هەر ڕۆژەی کتێبێیان لێ دەر ئەکەوێ. خاوەن پێنووسەکانیان بە پێنووس و خاوەن زانیاریەکانیان بە زانیاری و خاوەن تفەنگەکانیان بە ئەنگاوتن و وریایی و سیاسیەکانیش بە زمان و دەوڵەتمەندانیش بە دەوڵەت و خاوەن بانکەکان بە پارەی خۆیان، خەبات ئەکەن.

[7] جولەکە.

دیاره هەرچییەکیان هەیە بۆ میللەتی خۆیانەو میللەت لە هەموو شتێکی ئەمانە سوودمەند ئەبێت. ئەوانە وەکو ئێمە پیاوانی خۆیان لە ڕێی بێ سووددا نادەنە کوشت. پارەی خۆیان لە خۆڕا خەرج ناکەن، بێ سوود گەیاندنیش هەوڵ نایەن.

حاڵ ئەوەیە پیاوانی ئێمە بە یەکدی کوشتن دەمرن، پارەی ئێمە بۆ لەیزباران، موتریبان، دەروێشان، پەروو خەلاتن، میوانان و بەرتیلدان، دەڕوات. زمانمان بە باسکردنی یەکتری شل دەبێت.

ئەمە حاڵی ئێمەیەو ئەوەش حاڵی ئەوانە. ئەوان خەبات ئەکەن و ئێمە ڕۆدەنیشین. هەر کەسیش خەبات نەکات هیچ مافی ژیانی نیە. ئەوەش زانراوە کە ئێمە چەندێ لە دواوەین و ڕەقیبانمان چەندێ پێش کەوتوون! ئەمە بۆ ئێمە مایەی عیبرەتە، گەر ئێمەش عیبرەتێکی بچووك وەرگرین، ئێمەش وەکو هەموان دەگەینە ئاواتی خۆمان.

خودا هاوکارمان بێت، ئامین، بەڵێ لەبیرتان نەچێت خودا لە قورئاندا ئەمری فەرمووە "و إن لیس للأنسان الا ما سعی".

## خەوی ئێمە

ئیمڕۆ کە هەموو میللەتان لە خەونی بەیانی بێدار بوونەوەدان و بۆ ژیانی خۆیان خەبات ئەکەن، مەلایانی هەر میللەتێك لە بان منارەکانەوە بانگی سبەی دەدەن، هەوای سافی سبەی بەسەر هەموو بوونەوەرانەوە نیشانەی ژیان بڵاو دەکاتەوە، ئێمە هێشتا لە خەوداین. بەڵێ هەموان باری خۆیان بار کرد و وەڕێ کەوتن و ئێمەیان لە هەواری خۆمان جێ هێشتوە، لەو هەوارانەی کە بۆ خێری ئێمە کەس نەماوەتەوە، هەوارمان کۆن بووە و ماڵ و دەوارمان لەبەر ئەم گژووگیایانە وێران دەبن، کەنگێ ئێمە چاومان بکەینەوە...

– هەی هوو! برادەران ئێمە چیمان کرد! ئێواری ئێمە ناگەینە هیچ هەوارێك و مەڕەکەمان هەموو گورگ دەیخوات، ئێمە کەی بگەینە هەوارێك و سێڵەکەمان دابنێین و لەسەر نانەکەمان وت و وێژ بکەین و زارمان بکەینەوە! ئەمە چی بوو بەسەر خۆمان هێنا.. دوایی پەشیمانی سوودێکی نییە.

– ئێمە هێشتا لە خەوداین! ئێمە لە خەوێکی وادایـن تەنانەت مەلاکانیشمان کاتی بانگ لەوێ نین، کەڵەشێرەکانمان لاڵ بوون و ئەوانیش بانگ نادەن، کەرەی مەڕەکانمان لەسەری شوانەوە چوە، ئەوان هێشتا لە خەودان و ماستەکانی ئێمە لەبەر تیشکی هەتاودا لە مەنجەڵەکاندا ترشاون، دەوارەکانمان بەنەکانیان بچڕاون، چۆڵ کەوتون. ئێمە هێشتا لە خەوداین. ئیدی بەسە. قەت هیچ نەبێت. نوێژی بەیانی چوو، چونکە هەتاومان لێ هەڵهات. هێشتا ئێوارە نەهاتوە تا بێدار بینەوە. نوێژی نیوەڕۆ کاتی بێری لێمان نەڕوات، ئەگەر کاتمان لێ بڕوات مەڕەکەمان دەدۆشرێن، و ئێمەش لە شیر و ماست دەبین. ئەم جارە حاڵمان بە چی دەبێت. دەست بکەینە گریان، بەڵام بە گریانیش هیچ دروست نابێت. هەواڵی باب و باپیرانە کە وتوویانە (( گەر گریان سوودی ببا، باوکمی لە گۆڕ پێ ڕادەبوو)).

– من وتم "خەو". ئەقڵی تۆ نەچێتە خەوی شەوەوە لە بن نوێندا، بەڵکو خەوی شەو و ڕۆژانیش هۆی نەزانی و جەهالەتە – ئەگەر ئێمە– ئاوها نەخەوتباین و تەماشای مرۆڤایەتیمان بکردبا چۆن خەبات دەکەن، لە ژێر زەوی، سەر زەوی و ئاسمان و هەر ڕۆژەی شتێك دادێنن، تەلەفۆن، تەلەگراف، شەمەندەفەر، پاپۆڕ، تەلەگرافی بێ تەل[8].. ئەلەکتریك[9]، تەیارە، بالون... کە ئەمانە لە ئاسمانەوە نەباریون و لە زەوییەوە شین نەبوون، بەڵکو بە دەستی مرۆ دروست کراون.

– چی بە دەستی ئەوانە دروست کراوە؟

– ئەوانی بێدار، ئەوانی هۆشیار.

– ئەی ئێمە هۆشیار نین؟

– گەر ئێمە هۆشیار بواین، ئەو شتەی کە بۆ ئێمە پێویستییە، دەبوو بمانکردبا.

– چی بۆ ئێمە پێویستییە؟

– زانین.. زانین.. زانین..

## یەکگرتوویی10

– من وای دەبینم، هەر شتێکی کە بە هێزە، بە چەند دانەیەکی پووچ دروست بوە، نمونە: گرنگیی موویەك هیچ نیە، بەڵام کە کۆ دەکرێتەوەو دەڕێسرێ و دەبێتە بەن، بەنەکانیش پێکەوە لوول دەدرێنن دەبێتە گوریس، هێزی گوریسیش بینراوە کە بە سێ چوار پیاو ناتوانن بیپسێنن.

[8] لا سلکی

[9] کارەبا= بەرق.

[10] ئیتیفاق.

– هەر ئاوا تەماشای ئەکەم، توێکڵی کرکرکان پووشێکی بێ ئەهمییەتە، کاتێ دەیڕێسن دەبێتە کاب، کە کابەکانیش پێکەوە لوول ئەدەن دەبێتە ئەو خالاتانەی کەوا ئەو پردە گەورەو بەهێزانەی پێ دروست ئەکەن، کە وەك کەڵەك دەکشێتە ئەمبەر و بەر. دیسان تێدەفکرم ئەو چیا گەورانە دەبڕن و ڕێی لێ دروست ئەکەن، ئەوەندە کرێکار و وەستا ئیش دەکەن کە خەرجییان بە ملیۆنانە. عەجەبا ئەو پارانە لە کیسەی مرۆوە دەردەکەون؟

– نەخێر.

– بە چاو کۆی دەکەنەوە؟

– وەك ئەوەی هەر کەسێك لەوانە دە قروشی لێ ببڕن، یەك سەر دە قروش، هی هەزار کەس دە هەزار قروش ئەکات، ئەمەش لە دە مانگدا دەکاتە سەد هەزار قروش، کاری ئاواش ئەوەندە پارەی ببێ بانکێکی دەوێ، بەمەش چی دەکرێ، شەمەندەفەر دروست دەکرێ، و دونیای پێ لەیەك نزیك دەکەنەوە. دەریاکانی پێ تێکەڵ یەك دەکەن، بەرهەمیان دەبێت، ئیش دەکەن، و کڕیاریان دەبێت.

– هەر چۆنێ بێ شتی بێ ئەهمیەت کەوا ئێمە لێی دەفکرین، سامان لەسەر یەکگرتووی یەکبوونی، گەورە دەبێتەوە، مەبەست لەوەیە کە هەموو میللەت بەری ئەو یەکگرتوییە دەخوات و دواتریش لە کارو باردا سەرکەوتوو دەبن. مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە ئێمە لە هەموو میللەتان دواکەوتووین و ئەقڵێ لە بەن و ڕێسان و کاب و خالاتان وەرگرن، کۆ بن، ببنە یەك. ئەگەر نا، دەست بە خوێندنی فاتیحاو یاسین بکەن کە لە حزووری خوادا چۆن وەڵام ئەدەنەوە.

چونکو خوێنی میللەتێکی ئاوا ڕەبەن[11]، خوا لە ئێمەی دەوێ. لە من وتن و لە ئێوە یەکگرتووی و لە گەورەکان هیمەت و لە بچوکان غیرەت و لە ڕۆحیانەتی پێغەمبەر ئەلەیهی سەلات و سەلامی ئیمداد و لە خوداش سەرکەوتن.

## وڵات

ئیمڕۆکە لە دڵی هەموو یەکێکماندا، ئەوینێك هەیە، ئاگرێك هەیە کە هەمیشە بە عەشقەکەی بە ئەوینەکەی دەسۆزین. بە هۆی ئەو ئاگرەوە نە خاوەن ماڵین نە خاوەن کوڕ، نە خاوەن ژیانین، هەربۆیەکا ئامادەین هەموو شتێکی خۆمان لە پێناوی ئەم ڕێیەدا بدەین.

ئەمە چ عەشقێکە، چ ئەوینێکە؟

ئەلبەت ئەوینی وڵاتە.

لەوەی کاتێ لە وڵات هاتمە دەرەوە، هیچ شتیکی پێشووم لەبیر نەدەچۆوە، هەموو کاتەکان وا لە بەر چاوما، ئەو زۆزان[12]ی ڕەنگانە، ڕەنگەکان چۆن لە گوڵاندا خەمڵیبوون، سۆست و بەیبوونی تازە هەڵدەچوو، دەرکەوتنی کەوی سپی، ئەو هەوا سافانەی لە دوڵانەوە دەهات، نموونەی بەهەشت بوون، کەرەی مەڕی دۆی ژەنراو، لە نیشانەکانی سەربەرزیی کوردانە.

لە هەموو شوێنێ زۆزان هەیە، مەڕ هەیە، من نازانم لەبەر چی هەندێ لەو زۆزانانە، لەو چیایانە، لەو مێگەلانە،لای من شیرین دەنوێنن.

نازانم، ڕەنگە لە بچووکیما هەمیشە لەگەڵ وان بووبم و لەگەڵی گەشەم کردوە، یان ئەوەیە کە خوا ئافراندوونی ئاوا شیرین ئافراندوونی. یاخو کەسەکانمن کە بە زمانێکی شیرین پێم دەڵێن ئەمەیە هۆیەکەی.

تەنیا ئاگرێکەو ئەشقێکە چوار وەرزە لە من بەر بووە، هەمیشە دەمسووتێنێن دەمکوڵێنێت. کاتێ باسی وڵات دەکەن، من وا هەست دەکەم لە بەرانبەر ئەرکێکی گەورەدام، دەبێت لە ڕێی ئەو ئەرکەدا خەبات بکەم، لەو خەباتەدا گیانم ببەخشم، بمرم لە بۆ حاڵی دەنگێك لە ویژدانما، چی بڵێم، دەڵێم:

ئەقڵی خۆت کۆ وەکە، کاتی مردن نییە، کاتی ژیانە، بە پێی ئەم ئامۆژگارییە چاوم وەکەم، دەبینم چوار دەورەی خۆم، ئەوەی بۆ ژینیان پێویستە کەم زیفن.

لە نێوەندی ژین و مردنا وەستاوم، سەرسوڕماوو دۆشداماو، دەستم لە ژێر چەنە داناوەو خەم دەخۆم.

ئا لەو بارەمدا گوێم لە خوێندنی قورئان بوو، گوێم هەڵخست، سوورەتی تەنزیل بوو، ئایەتی (( لا تەقنەتوو مین ڕەحمەتیڵلاّ))م بەر گوێ کەوت. بەو مژدەیە هەڵسامە پێیان، نەخشەی وڵاتی خۆم کردەوە، ناوی شارو گوندانم خوێندەوەو کەمێك تەسەللام هات.

[11] ڕەبەن مەبەست بێکەس و بێ لانەیە.

[12] باخ و سەوزایی.

# لەبارەی (مەمی ئالان)ەوە...
# یەکەم شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا

کامەران سوبحان

زۆرجار لە ئەدەبیاتی کوردیدا کە باس لە شیعرو چیرۆك وسەرەتاکانی سەرهەڵدان و گەشەکردن و قۆناغە جیاوازەکانی دەکرێت، بۆ هەریەك لەم لایەنانەش بۆچوونی جیاوازو هەندێجاریش دژ بەیەك هەیە، بەڵام لە باسکردنی ئەدەبیات و تێکستی شانۆییدا کەمتر ئەو گیروگرفتە هەیە، ئەوەندە نەبێت جیاوازییەکە لە ئەدەبیاتی شانۆییدا لەسەر مێژووی نمایشەکانە نەك تێکستە نووسراوەکان، ئەمە لە کاتێکدا بۆ پۆلێنکردن و تێگەیشتن لە لایەنەکانی ئەدەب پێشوەخت ساغکردنەوەی تێکستەکە بۆ خوێنەر پڕبایەخترو کاریگەرترە.

دەقی شانۆیی لە ئەدەبیاتی کوردییدا پێچەوانەی نمایشە شانۆییەکانە، چونکە لەم لایەنەوە هونەرو ئەدەبیاتی کوردی یەکجار هەژارە و بگرە زۆر جاریش ئەو مێژووە دیار نییە، بە تایبەتیش ئەو دەقانەی کە بە زمانی دایك نووسراون، چونکە پێشتر لە ئەدەبیاتی کوردستانی باکور و ڕۆژهەڵاتدا ناوی چەند دەقی شانۆنامە و نووسەری شانۆییمان بەرگوێدەکەوێت کە دەقییان نووسیووە، بەڵام بە داخەوە بە (فارسی و تورکی)بوون، بەڵام ئەوەی تا ئێستا لەلایەن توێژەرانەوە ساغکراوەتەوە یەکەم دەقی شانۆیی لە ئەدەبیاتی کوردیدا بە زمانی کوردی نووسرابێت (مەمی ئالان)ەکەی (عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری)ە لە کوردستانی باکور.

مەمی ئالان لەساڵی ١٩١٩ دا (عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری) لە ئەستەمبول نووسیوویەتی وبڵاویکردووەتەوە، تا پێش ئەم مێژووەش ناوی هیچ نووسەر و دەقێکی شانۆییمان نییە کە بە کوردی نووسرابن، شانۆییەکەش بە بەراورد بە تەکنیك و بنەمای نووسینی دەقی شانۆیی لە ئاستێکی بەرزدایە و لە شانۆییەکی دوو پەردەیی کورت پێکهاتووە، ئەم شانۆنامەیەش هەموو بنەماکانی (زمان و چیرۆك و تەکنیك)ی شانۆیی تێدا پەیڕەوکراوە، هەرچەندە دەقە شانۆییەکەی لە دوو پەردەی کورت پێکهاتووە، بەڵام تایبەتمەندییەکی زۆری دەقی شانۆیی تێدا پەیڕەوکراوە، بێگومان ئەم تایبەتمەندییەش بۆ ئەدەبیاتی شانۆی ئێمە گرنگە، بۆیە لێرەدا هەوڵدەدەین هەریەك لەو ڕەگەزانەی تێکستە شانۆییەکەی (عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری) بەجیای لێبدوێین و هەڵوێستەیەکی خێرای لەئاستدا بکەین.

### *زمان:

هەروەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ئەم دەقە شانۆییە لە دوو پەردەی کورت پێکهاتووە، تایبەتمەندی ئەو دەقە شانۆییانەش کە یەك پەردەی و دوو پەردەیی کورتن جیاوازترن لەو دەقە شانۆیانەی کە درێژو چەند پەردەین، بە تایبەتی لە رووی زمانی گەیاندنەوە، چونکە زمان لەم شانۆییە کورتانەدا پێویستە زیاتر چڕبکرێتەوە و زووتر مانا بدات بە خوێنەر، بۆیە لەم شانۆییانەدا کەمتر نووسەر دەتوانێت زمانی مەجازو مانا شاردنەوەی بندێڕەکان بەکاربێنێت، بۆئەوەی لە زوترین و کەمترین رستەدا زۆرترین مانابگەیەنێت بە خوێنەر، هەروەك لەیەکەم دێڕی تێکستە شانۆییەکەدا (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) بە زمانێکی راستەوخۆ و بێ هیچ شاردنەوەو زەمینەسازییەك راستەوخۆ دەچێتە ناو سەرەتای چیرۆکی شانۆییەکەوە، ئەمە پێچەوانەی تایبەتمەندی شانۆییە چەند پەردەییەکان کەی رەنگە خوێنەر چەند لاپەرەیەکی تێکستە بخوێنێتەوە یان چەند دەقیقەیەکی نمایشە ببینێت ئەوسا بزانێت رووداوەکان چۆن روودەدەن، بەلام لە (مەمی ئالان)ەکەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) یەکەم رستە خوێنەر بە چیرۆکی شانۆییەکە لەسەر زمانی (مەم)ی پاڵەوان بە دیالۆگێکی دورودرێژ ئەو مانایە دەگەیەنێت کە لەیەکەم دیالۆگدا زمانێکی زۆر تایبەتمەندی شیعرییانە پەیرەوکراوە کە دەڵێت: (ئەمڕۆ میر ئەمری کردووە، غەزایە. رێگرتنە لە نەیاران. نەبا خوانەخواستە زاری کوردان بەردەستی دوژمنان کەوێت، من لە کێ کەمترم؟ گوایە من کوردنیم، چما ناموسی کوردان ناموسی من نییە؟ دەبێت بچم، تەنانەت غەزالیش رێم لێبگرێت هەر دەبێت بچم.... من مەمی ئالانم . میری هەکاری ئەمریکردووە، سوڵتان سەلاحەدین شیری خۆی لە کێلان دەرکێشاوە و لە پێشەوەی ئەو عالەمەوە وەستاوەو پارێزگاری لە قودسی شەریف دەکات، خەڵکانی غەیرە دین کۆبوونەتەوە بۆئەوەی ئەوی لە موسوڵمانان بسەننەوە...)

لەم یەکەم دیالۆگەی شانۆییەکەوە تا رادەیەك خوێنەر بە بەشێکی گرنکی چیرۆکی سەفەری پاڵەوان ئاشنا دەبێت کە بۆ کوێ و بۆچی دەڕوات؟ ئەمە پرسیارێکی سەرەکی بنەمای چیرۆکە لە دەقی شانۆییدا کە پێویستە لە دروستکردنی پاڵەوانـدا نووسەر وەلامی بداتەوە، بەلام (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) خۆی لەیەکەم دیالۆگی شانۆنامەکەدا بە زمانێکی بێخەوش و پاك ئەو پرسیارە وەلامدەداتەوە، ئەو لە دەقەکەدا و لەیەکەم دێڕەوە ئەوەمان پێدەڵێت (پاڵەوان) لەیەکەم دیمەنی شانۆییەکەوە شوێن جێدێڵێت، ونبوونی پاڵەوان بە شێوەیەکی مەجازی و کاریگەربوونیشی لە دەقێکی شانۆییدا و گۆڕینی رێرەوی رووداوەکان گرنگترین تەکنیکە کە نووسەری شانۆیی لە شاعیر و چیرۆکنووس جیادەکاتەوە، کە رەنگە لە تێکستی شانۆدا ئەم لایەنە بە زمان و تەکنیك زیاتر بتوانرێت لای خوێنەر گرنگتربێت، هەروەك (مەمی ئالان) لەم دەقە شانۆییەدا کە پاڵەوان رووداوو شوێن جێدێڵێت و بۆ یەك چرکەش بێ کاریگەری نابێت لە شانۆییەکەدا، بە جۆرێك بە کەمکردنەوەی یەك دێڕی پاڵەوانەکە قورسایی ئەو پاڵەوانە کەم دەبێتەوە.

هەڵبژاردنی هەریەك لەو وشانەش کە لەو دیالۆگەی (مەمی ئالان)دا هەیە لایەنێکی بەهێزی زمان پاراویی نووسەرن کە دەتوانێت بەو توانا بەرزەوە ئەو گوزارشتانە بکات، ئەمە جگە لەوەی کاریگەریی زمانی شاعیربوونی خودی (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) زۆر بە سەر ئەم شانۆییەوە دیارە، ئەمە جگە لەوەی هەندێ لە دیالۆگەکان لەسەر بنەمای شیعر داڕێژراون و فۆرمێکی شیعرییان هەیە، لە بەشێکی زۆری رووداوە گرنگەکانی ئەم شانۆییەشدا دیالۆگەکان بە شیعر و بەیت چنراون، دواهەمین رستەی شانۆییەکەش بە پارچە شیعرێك کۆتایی دێت کە هەردوو کارەکتەری شانۆییەکە (غەزال و چاو ڕەش) دەیڵێین کە دەڵێت:

**هەرێ مەمۆ، مەمێ ئەباسی، ئەباسی**
**بریندارۆ مەمۆ، دایێ کۆربت نەناسێ**

ئەمە جگە لەوەی چەندین دیالۆگی نێوان کارەکتەرەکان لە شانۆییەکە دا بە شیعر داڕێژراوە، ئەمەش هێندەی تر پەیوەندی نێوان شیعر و شانۆ لەم دەقەدا قوڵتر دەکاتەوە، بۆ نمونە:

**غەزال مەمۆ ئیرۆ بوو بە عەسکەرە**
**ئەڤینیا من بوو کەسەرە**
**تۆ من ببە دگەل خوە، هەرە**
**یان بکوژە، یان بکوژ، پاشی هەرە**

مەمۆ: تۆ بەس روهنكان ببارینە
ئیرۆ دوژمن مەكینە
وەستانا من لائیق نینە
غەزالا من دەلالا من بەس بگری

هەروەك چۆن بەرزو نزمی ریتمی شانۆییەكە و رووداوەكان هەمان ریتمی نووسینی بەشێكی زۆری شیعرەكانیشییەتی، كە زمانی نووسینی هەردوو ئەو رەگەزە ئەدەبییە (شیعر و شانۆنامە) تارادەیەكی زۆر لایەنی (نیشتیمانپەروەری و ئاینی) پێوەدیارە، چونكە لەسەرەتای شانۆییەكەوە خوێنەر دەزانێت (مەم)پاڵەوانەكە پیاوێكی موسوڵمان ونیشتیمانپەروەرەو لە پێناوی ئەو دووانەشدا دەچێت بۆ غەزا.

ئەمە جگە لەوەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەكاری) چەندین شیعری ئاینی و نیشتیمانپەروەریی هەیە و ئەم دوو لایەنەش لە زۆرێك لە شیعرو شانۆییەكەشیدا رەنگیداوەتەوە..

*چیرۆك:

هیچ قوتابخانە و میتۆدێكی شانۆیی نییە كە بایەخ بە چیرۆك نەدات، تەنانەت كە باس لە قوتابخانەی پۆچگەرایی لە ئەدەبیاتی شانۆییدا دەكرێت كە زۆرێك لە بنەماكانی دەقی شانۆیان تێكشكاندووە، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەكان ئەم قوتابخانەیەش چیرۆكیان لە درێژدادڕی و جوینەوە رزگاركردو لە قاڵبێكی جیاوازتردا بنەمای چیرۆكی شانۆیان دارشتەوە، هەر ئەمەش وایكرد چیرۆكی ئەو دەقە شانۆییانەی كە بە شانۆی پوچگەرا ناو دەبرێن جۆرێك لە تەشویق و سەرنجراكێشی و ناباوی پێوەدیاربێت..

ئەم شانۆییەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەكاری)یش لە چیرۆكێكی پوخت و پڕ لە مانادا كرۆكی شانۆییەكەی خستوەتە روو. ئەویش لەوێوە دەستپێدەكات كاتێك كە میری هەكاری ئەمر دەكات كوردان بچن بۆ پاڵپشتكردنی سەلاحەدینی ئەیوبی لە قودس،(مەم)یش دەچێت بەدەم ئەو داوایەی میرەوەو غەزالی تازە خێزانی و دایكی بە جێدێڵێت، دوای چەندین ساڵ كە دەگەڕێتەوە بۆ لای دایك و خێزانەكەی، دایكی نایناسێت و وا دەزانێت ئەوە بێگانەیە هاتووەتە لای بوكەكەی، بۆیە بە هەڵە كوڕەكەی خۆی دەكوژێت، بەم هەڵە كووشتنە كۆتایی بە شانۆییەكە دێت..

لەم چیرۆكە كورتەدا ئامڕازگەلێكی زۆر هەیە لە بنەما و تایبەتییەكانی چیرۆكی شانۆیی بە تایبەتی لەو بنەما بەدحاڵیبوونەی نێوان (چاورەش و مەم) كە دایكێك كوڕەكەی خۆی ناناسێتەوە، ئەم كردەیە لە شانۆییەكە دەربهێنە، چیرۆكەكە هیچ مانا و دەلالەتێكی نامێنێت، ئەوە دوا كردار و دوا رووداوی شانۆییەكەیە كە لە كوشتنی مەمدا خۆی دەبینێتەوەو وادەكات ئەم شانۆنامەیە بنەمایەكی تایبەتمەند وەرگرێت و چیرۆكەكەشی لە رووی دارشتنەوە وەك چیرۆكێكی پڕكاریگەری شانۆ ببینرێت.

راستە لە سەرەتای شانۆییەكەوە پاڵەوانی شانۆییەكە خوێنەر بە دوای خۆیدا رادەكێشێت بۆ ئەوەی بە دوای (مەم)ی پاڵەوان كەوێت، بەڵام رۆشتنی پاڵەوان لەو چیرۆكەدا بۆ غەزا و هاتنەوەی بۆ لای تازە هاوسەرەكەی و دایكی هیچ مانایەكی نابێت جگە لە گێڕانەوەیەكی تەقلیدی، رەنگە لە هەندێ جومگەدا وەك بە جێهێڵانی نیشتیمان و غەریبایەتی و رۆیشتن بۆ بەرەكانی جەنگ جۆرێك لە فەنتازیای تێدابێت، بەڵام ئەو حاڵەتانە لە رەگەزەكانی تری ئەدەبیشدا هەیە، ئەوەی زیاتر لەم دەقە شانۆییەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەكاری)دا پڕ بایەخ و كاریگەرە، كۆتاییە پڕ تراژیدییەكەی شانۆییەكەیە، كە هێندەی تر رووداوەكانی چیرۆكی شانۆییەكە كاریگەرتر دەكات لای خوێنەر و بینەر.

*تەكنیك:

ئەو دوو رەگەزەی سەرەوە لە تێكستی شانۆییدا پەیوەندییەكی بەتینیان بە رەگەزی سێیەمەوە هەیە كە (تەكنیك)ە، بەو پێیەی ئەم تێكستە شانۆییەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەكاری) لە ساڵی ١٩١٩ لە كوردستانی توركیا نووسراوەو لەو قۆناغەشدا ئەدەبیاتی توركی بە گشتی و ئەدەبیاتی شانۆیی لە توركیا لە ئاستێكی پێشكەوتوودابووە لە چاو شانۆی وڵاتانی ناوچەكە، بۆیە زۆر بە وردی لەم دەقە شانۆییە وردبینەوە دەبینین هەمان بنەما و تەكنیكی دەقی شانۆیی هەیە كە لەو قۆناغەدا شانۆی پێنووسراوە لە ئەوروپادا، رەنگە ئەم حاڵەتەش پەیوەندییەكی بەهێزی بە كرانەوەی ئەدەبی توركی هەبێت بەسەر ئەدەبیاتی ئەوروپیدا..



خاڵێك لەم دەقە شانۆییدا جێگەی سەرنجە، ئەویش تەکنیکی نووسینی شانۆییەکەیە، راستە شانۆییە لەو چیرۆکەی سەرەوە دروستبووە کە خستمانە ڕوو، کە خۆی لە چیرۆکێکی (تراژیدی، خۆشەویستی، ئاینی)دا دەبینێتەوە، بەڵام تەکنیکی نووسینەکەی بە شێوازێکە لە هەر بەشێك لە بەشەکانی شانۆییەکەدا خوێنەر هەستدەکات چیرۆکی گێڕانەوە بە تەکنیکێکی سەرنجڕاکێش نووسراوە کە تا رادەیەکی زۆر لە نووسینی کورتە چیرۆك دەچێت بە دەر لە دیالۆگ و سیناریۆی رستەی پاڵەوانەکان، ئەمە جگە لەو بە دحاڵیبووونەی کە لە دەقەکەدا روودەدات کە بە بڕوای من بنەمای تەکنیکی ئەم شانۆییە لەسەر ئەو بەشە نووسراوە کە کۆتاییەکەیەتی کاتێك غەزال بە رێکەوت و بە نا مەبەست خوێنی کوڕە تاقانە تازە زاواکەی دەڕژێت و لەم روداوە تراژیدییەشدا(عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) کە ترۆپکی تەکنیکیی شانۆنامەکەیەتی کۆتایی بە چیرۆك و روداوی شانۆییەکە دێنێت.

ئەم کۆتاییەو هەندێ لە رێڕەوی روداوەکان و بەدحاڵیبوونی نێوان کوڕ و دایك لەم شانۆییەدا وا دەکات هەندێ کەس ئەم شانۆییەی (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) بەراورد بکەن بە شانۆگەریی (بەدحاڵیبوون)ی نووسەری فەڕەنسی (ئەلبێر کامۆ) کە تا ڕادەیەك رێڕەوی چیرۆکی ئەم دوو شانۆییە لە یەك دەچێت، لای (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) (مەمۆ)ی پاڵەوان دوای سەفەرێکی دووردرێژ لە غەزا دەگەڕێتەوە بە دەستی (چاو ڕەش)ی دایکی بە بێ مەبەست دەکوژرێت، لە (بەدحاڵیبوون)ی ئەلبێر کامۆش (ژان) بۆ ماوەیەکی زۆر دەچێتە دەرەوەی وڵاتی خۆی بۆ بازرگانی و دواتر لە گەڕانەوەیدا بە دەستی (ماری کارلف)ی دایکی بە بێ مەبەست کە نازانێت کوڕەکەیەتی دەکوژرێت.

لە هەردوو شانۆییەکەدا کوڕە تاقانە بە دەستی دایك بە بێ مەبەست دەکوژرێن، لە هەردوو شانۆییەکەدا کوشتنەکە بەهۆی هەڵە تێگەیشتن و بەدحاڵیبوونەوەیە نەك بە مەبەست، بەڵام دەقەکەی کامۆ لە چەند دیمەن و چەند بەشی دورو درێژ پێکهاتووە، بەڵام ئەوەی(عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) تەنها لە دوو دیمەن پێکهاتووە، ئەمە لە کاتێکدا (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) ئەم دەقەی لەساڵی ١٩١٩ نووسیووە و ئەلبێر کامۆ (بەدحاڵیبوون)ی لە ساڵی ١٩٤٤ نووسیووە، بۆ ئەم لێکچوونە د. فەرهاد پیرباڵ لە کتێبەکەیدا (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری... تازەکردنەوەی شیعری کوردی و داهێنانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا) پێیوایە کە رەنگە ئەم چیرۆکە ئەفسانەیەکی ناوچەکە بێت و هەر دوو نووسەر سودیان لەو ئەفسانەیە وەرگرتبێت، بە تایبەتیش کە (ئەلبێر کامۆ) لە جەزائیر لەدایکبووەو ماوەیەکی زۆر لە هەندێ ناوچەی عەرەبنشین ژیاوە، کە رەنگە ئەو چیرۆك و ئەفسانە میللییە مولْکی ناوچەکەبێت و هەردووکیان لە دوو قۆناغی جیاوازدا وەك تەکنیك و چیرۆك سودیان لێبینیبێت بۆ نووسینی شانۆنامەکانیان.



عبدالرحیم هەکاری لە سالێ ١٩٥١، جانتایەک بەدەستیەوە، ل گەل وفدی کۆنفرانسی ئیسلامی، دەچیتە پاکستان



No 36 — 2e année 21 Juin 1920

JINE

(La vie)

Journal hebdomadaire kurde

Adresse: Sublime porte—rue Eboussouds.

ژماره (٣٦)ی رۆژنامەی (ژین) لە ئەستەمبۆڵ، کە لە سالی ١٩٢٠ دەرچووە، ئەو شیعری ناوبراوی بلاوکردۆتەە کە بە ناونیشانی «شەهیدێ کوردستان.. هەمزە بەگ» نووسیویەتی.
هەر لەوێشدا بابەتێکی زمانەوانیی بلاوکردۆتەوە.




یەکێک لە گۆڤارە شانۆییەکان لە ئەستەمبۆڵ ١٩١٥




ئارمی یەکێک لە کلووبە شانۆیەکان لە ئەستەمبۆڵ